# ڕێزمانی نۆرویژی بەشی سێیەم
# Norsk grammatikk part 3

## ناوەڕۆك

# Pronomen جێناو

**چەند وشەیەك لەسەر جێناو:**

**لە زمانی کوردیدا بێجگە لە زاراوەی جێناو، هەندێ جار سوود لە زاراوەکانی "راناو"، " جێناڤ"، "راناڤ" و "بەرناو"یش وەردەگیرێت، بەڵام هەموویان هەر یەك مانایان هەیە. جێناو وشەیەکە کە لە جێی ناوی کەسێك یان شتێك دێت، واتە دەبێتە جێگرەوەی ناو. لە زمانی کوردییدا دەکرێ لە سێ روانگەوە لە جێناو بکۆڵینەوە:**

**یەکەم: جێناو لە رووی واتاوە: واتە جێناوی کەسییە یان جێناوی خۆییە یان جێناوی چەندی و جێناوی نیشانە .... هتد**

**دووەم: جێناو لە رووی پێکهاتەوە: ئایا جێناوەکە سادەیە، دارِژاوە یان لێکدراوە**

**سێیەم: جێناو لە رووی ئەرکەوە: ئایا بکەرە، بەرکاری راستەوخۆیە یان بەرکاری ناراستەوخۆیە... هتد؟**

**ئەوەی باسکرا لەسەرەوە، بە شێوەیەکی گشتی لەسەر جێناو بوو لە زمانی کوردیدا، بەڵام لێرەدا بە پێی پێویستی رێزمانە نۆروێژیەکە لەسەر جێناو قسان دەکەین. لەبەشی یەکەم و دووەمی رێزمانی نۆروێژی باسمان لە جێناوی کەسیی کرد، ئێستا لەم بەشەدا باس لە <u>جێناوی خۆیەتی</u> دەکەین.**

**<u>سەرەتا با بزانین جێناوەکانی det و den چلۆن بەکاردێن:</u>**

**لە زمانی نۆروێژیدا بۆ ئاژەڵان و شتە بێگیانەکان سوود لەم دوو جێناوە وەردەگیرێت. سەیری کۆتایی جێناوەکان بکە!**

**Det وەکوو دەبینی کۆتایی ئەم جێناوە بە et کۆتایی هاتووە.**

**Den وەکوو دەبینی کۆتایی ئەم جێناوە بە en کۆتایی هاتووە.**

**ئێمە پێشتر باسمان کرد کە ئامرازی پێناساندنی et بە کار دێت بۆ ئەو ناوانەی کە نێرمۆن ( واتە نە نێرن نە مێ) و هەروەها ئامرازی پێناسینی en بە کار دێت بۆ ئەو ناوانەی کە نێرن. لە بۆیە ئەگەر ناوی گیانلەبەرێك یان بێ گیانێك هات و نێرمۆ بوو، ئەوا سوود لە جێناوی det وەردەگرین، و هەروەها ئەگەر نێرمۆ نەبوو، ئەوا سوود لە جێناوی den وەردەگرین.**

چەند نمونەیەك:

| | |
|---|---|
| Ken har *en hybel.* | **Den** er i første etasje. |
| کێن هیبل(ژووروٚچکە)یەکی هەیە | **ئەو(هیبلەکە) لە تەبەقەی یەکەمە** |
| Anna har *ei veske.* | **Den** er fin. |
| ئانا کیفێکی هەیە | **ئەو( کیفەکە) زۆر جوانە** |
| Hybelen har *et skap* | **Det** er stort. |
| هیبلەکە کاوەنتەرێکی هەیە | **ئەو(کاوەنتەرەکە) گەورەیە** |

En → den

Ei → den

Et → det

## Refleksive pronomener جێناوی خۆیەتی

ئەم جێناوە جۆرێکە لە جۆرەکانی جێناو لە رووی واتاوە، خاوەندارێتی دەگەیەنێت. جێناوی خۆیەتی لە زمانی کوردیدا بریتی یە لە (خۆ):

خۆم --- خۆمان

خۆت --- خۆتان

خۆی --- خۆیان

کاتێك بکەر (فاعل)ی رستەکە لە هەمان کاتدا بەرکار(مفعول)یش بێت، ئەوا سوود لە جێناوی خۆیەتی وەردەگرین. لە زمانی نۆرویژی زۆربەی کارەکان جێناوی خۆیەتی وەردەگرن.

Jeg -→meg

Du → deg

Han → seg

Hun → seg

Det/den → seg

Vi → oss

Dere → dere

De → seg

| | | | |
|---|---|---|---|
| Jeg | Vasker شوشتن | **meg**. | خۆم |
| Du | vasker | **deg**. | خۆت |
| Han | vasker | **seg**. | خۆی |
| Hun | vasker | **seg**. | خۆی |
| Det/Den | vasker | **seg**. | خۆی |
| Vi | vasker | **oss**. | خۆمان |
| Dere | vasker | **dere**. | خۆتان |
| De | vasker | **seg**. | خۆیان |

هەندێ جار جێناوەخۆیەتیەکان لە زمانی نۆرویژی هاواتای کوردی نییە، واتە ناکرێ راستەوخۆ دقاودق تەرجەمەی کوردی بکرێن

| | |
|---|---|
| å barbere seg | ریش تاشین |
| å glede seg til | خۆشحاڵ بوون بە |
| å kle på seg | جل لەبەرکردن |
| å sette seg | دانیشتن |
| å tørke seg | خۆ وشك کردنەوە |

# Navn ناو

## Genitive خاوەنداریەتی

**بەو ناوەی یان جێناوەی کە بەدوای ناوێکی دیکەدا دێت بۆ ئەوەی ماناکەی تەواو بکات یان شیکردنەوەی زیاتری لەسەر بدات, دەوترێت دیارخەر, بەو ناوەش کە دیارخەر شیکردنەوەی لەسەر دەدات دەوترێت دیارخراو.**

**حاڵەتی ناوی دووەم کە زیادکراوە بۆ ناوی یەکەم پێی دەوترێت خاوەنداریەتی.لە زمانی نۆروێژی دیارخەر لە پێش**

**دیارخراوەوە دێت و ئامرازی پەیوەندی نێوانیشیان s ە کە دەخرێتە کۆتای دیارخەرەوە ( ئەو ناوەی کە لە سەرەتاوە دێت )**

**Evas bøker** کتێبانی ئێڤا

**Azadssykel** پاسکیلی ئازاد

**Norgesflag** ئاڵای نۆروێژ

**بەو شێوەی کە لە نمونەکانی سەرەوە دەبینرێت, ناوی یەکەم ( دیارخەر)واتە ئەو ناوەی کە s ی پێوە لکاوە, دەبێت**

**بە شێوەی ناسراو** bestemt **بنوسرێت. وە ناوی دووەم کە ( دیارخراوە ) دەبێت بە شێوەی نەناسراو** ubestemt

**بنوسرێت.**

Guttens bok

Guttens bøker

**بۆ دەربڕینی حاڵەتی خاوەندارێتی لە زمانی نۆروێژی دەکرێت سوود لە ڕێگایەکی دیکەش وەربگیرێت. هەروەك لە زمانی**

**کوردی دیارخراو لە سەرەتاوە دێت وە دیارخەریش لە کۆتا دێت و لە جیاتی ئامرازی پەیوەندی s سوود لەم وشانە**

**til, av, på وەردەگیرێت.لەم حاڵەتەدا دیارخەر ودیارخراو هەردووکیان بە** bestemt **بەکاردێن.**

Kjolens pris = prisen på kjolen **نرخی کراسەکە**

Guttens bil = bilen til gutten **ئۆتۆمبێلی کورەکە**

Norges konge = kongen av Norge **پاشای نورویژ**

## Spesial flertall form هەندێك تایبەتمەندی ناوی کۆ

لە بەشی دووەم باسمان لە ناسراوی و نەناسراوی ناوی کۆ کرد بە هۆی زیاد کردنی er و ene، بەڵام هەندێك لە ناوەکان پەیڕەوی لە یاسای سەرەکی ناکەن، واتە تایبەتن.

1- ناوی نێرمۆی کورت( یەك بڕگەیی) لە کاتی کۆ کردنەوە er وەرناگرێ:

| | | | |
|---|---|---|---|
| et bord<br>یەك مێز | bordet<br>مێزەکە | bord<br>چەند مێزێك | bordene<br>مێزەکان |

-

2- کاتێك ناوەکە کۆتایی بە er هاتبوو ئەوا لە کاتی کۆکردنەوە e و ne ی بۆ زیاد دەکەین:

| | | | |
|---|---|---|---|
| en italiener<br>ئیتالیەك | italieneren<br>ئیتالیەکە | italienere<br>چەند ئیتالیەك | italienerne<br>ئیتالیەکان |

3- کاتێك ناوێك کۆتایی بە el هاتبوو ئەوا لە کاتی زیاد کردنی er و ene، پیتی e لادەبەین. هەروەها لە دوو نەبزوێنەکەش ( لێرە دوو دانە پیتی k هاتووە) کەمی دەکەینەوە بۆ یەك دانە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| en nøkkel<br>a key | nøkkelen<br>the key | nøkler<br>keys | nøklene<br>the keys |

هەندێك لە تایبەتمەندی دیکەی ناو کە پەیرەوی لە یاسای سەرەکی ناکەن

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ei bok | کتێبێك | boka | bøker | bøkene |
| en bror | برایەك | broren | brødre | brødrene |
| ei søster | خوشکێك | søstera | søstre | søstrene |
| en far | باوکێك | faren | fedre | fedrene |
| ei mor | دایکێك | mora | mødre | mødrene |
| en mann | پیاوێك | mannen | menn | mennene |

# Adjektiv ئاوەڵناو

هاوەڵناوەکان لە حاڵەتی نێرمۆ لە کۆتاییەکەی پیتی t ی بۆ زیاد دەکرێ. و لە کاتی کۆکردنەوەش پیتی e دەخرێتە کۆتایی ئاوەڵناوەکە.

لەمانەی خوارەوە وەکوو دەبینرێ هاوەڵناوەکە بەر لە ناوەکە هاتووە کە وەسفی دەکات:

| تاك نێر | مێ | نێرمۆ | کۆ |
|---|---|---|---|
| en **brun** stol<br>کورسیەکی قاوەیی | ei **brun** seng<br>تەختەخەوێکی قاوەیی | et **brunt** bord<br>مێزێکی | **brune** stoler/senger/bord<br>چەند کورسی، تەختەخەو و مێزێکی قاوەیی |

لەمەی خوارەوە وەکوو دەبینی ئاوەڵناوەکە چۆتە دوای ناوەکە، ئەمەش حاڵەتی ناسراوی ناوەکە نیشان دەدات:

| **تاك نێر** | **مێ** | **نێرمۆ** | **کۆ** |
|---|---|---|---|
| Stolen er **brun**.<br>کورسیەکە قاوەییە | Senga er **brun**.<br>تەختە خەوەکە قاوەییە | Bordet er **brunt**.<br>مێزەکە قاوەییە | Stolene/sengene/bordene er **brune**.<br>کورسیەکان، تەختەخەوەکان و مێزەکان قاوەیین |

# Adverb ئاوەڵکار

هەندێك لە ئاوەڵکارەکان دوو شێوەیان هەیە، یان ئەوەی کە جوڵاون (واتە لە حاڵەتی ڕوودانی شتەکەیە)

یان ئەوەی جێگیرن (واتە شتەکە ڕوویداوە)

| دەجوڵێ | | جێگیرە | |
|---|---|---|---|
| Han går **inn**.<br>ئەو دەڕواتە ژوورێ | ژوورێ | Han er **inne**.<br>ئەو لە ژوورێیە | ژوورێیە |
| Han går **ut**.<br>ئەو دەڕواتە دەرێ | دەرێ | Han er **ute**.<br>ئەو لە دەرێیە | دەرێیە |
| Han går **opp** i 2. etasje.<br>ئەو دەڕواتە سەرێ بۆ تەبەقی دووەم | سەرێ | Han er **oppe**.<br>ئەو لە سەرێیە | سەرێیە |
| Han går **ned** i 1. etasje.<br>ئەو دەڕواتە خوارێ بۆ تەبەقی یەکەم | خوارێ | Han er **nede**.<br>ئەو لە خوارێیە | خوارێیە |
| Han går **hjem**. | ماڵێ | Han er **hjemme**. | ماڵێیە |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئەو دەڕواتە ماڵێ | | **ئەو لە ماڵێیە** | |

## جیاوازی نێوان hit og her --- dit og der

| دەجوڵێ | | جێگیرە | |
|---|---|---|---|
| Han kommer **hit**.<br>ئەو دێتە ئێرە | ئێرە | Han er **her**.<br>ئەو لێرەیە | لێرە |
| Han går **dit**.<br>ئەو دەڕواتە ئەوێ | ئەوێ | Han er **der**.<br>ئەو لەوێیە | لەوێ |

# Preposisjoner ئامرازە پەیوەندییەکان

## جیاوازی نێوان i و på

یاسای سەرەکی

i

ئەم ئامرازە پەیوەندییە ئامرازی شوێنە، کە لەگەڵ ناوی کیشوەر(قاڕە)، وڵات، پارێزگا و شار بە کار دێت

på

ئەم ئامرازە پەیوەندییە ئامرازی شوێنە، کە لەگەڵ شاری ناوەخۆ، ناوچە، ڕێکخراو یان دامەزراوە بە کار دێت

بە واتایەکی دیکە: لەگەڵ ناوچەی گەورە وەکوو وڵات و شار i بەکار دەبەین و لەگەڵ ناوچەی بچوک و دورگە på بەکاردەهێنین.

| | |
|---|---|
| **i** Europa کیشوەر | **på** Røros, Lillehammer گوند، شارەوانی، شارۆچکە |
| **i** Norge وڵات | **på** Gløshaugen, Dragvoll, Lade ناوچە |
| **i** Sør-Trøndelag پارێزگا | **på** NTNU, universitetet, Sintef زانکۆ، ڕێکخراو |
| **i** Trondheim شار | |